لەسەر شەرە شیرو تیرهاویشت، بەسەر بەندەکانیانەوە فێریان ئەکردن، ئیتر گیانی پاکی بێتاوانیان بەرەو خوای خۆیان، دەم بەهاوارو سکالاکردنەوە بەرز ئەبۆوە بەبێئەوەی هیچ کەسێك هەناسەیەك هەڵکێشێ بە دوایاندا!

ئاواز: سەرم گێژ ئەخوات! خەریکە دڵم تێکهەڵدێت لەداخا! ئەی هاوار!!

دڵپاك: ئەگەر بەندەیەك ئاغاکەی خۆی تووڕە بکردایە، یان بەرپەرچی قسەی بدابایەیەتەوە، زمانیان ئەبڕی، ئاوی گەرم یان زەیتی گەرمیان ئەکرد بە قوڕگیا بەبەرچاوی خەڵکەوە، ئاغاکەی مافی ئەوەی هەبوو کە بیفرۆشێ، ببەخشێ، تەنانەت بیکوژێ، خوێنی ئەوو مشکێك یەکسان بوو!! پیاوەکانیان ئەخەسێنران وەك چۆن ئێستا گا ئەخەسێنرێت، لەناو بازاڕدا بەنێرو مێیانەوە مۆڵیان ئەدان، کڕین و فرۆشتنیان قازانجێکی ئەوتۆی هەبوو، چاك بازرگانییەك بوو، کڕیار ئەهات و چەند دانەی بویستایە ئەیکڕی و وەك جەڵەبی ئاژەڵ ئەیدانە بەر خۆی، هەر بۆنموونە: لەشاری (ڕۆما)دا بازاڕێك بەسەر گردێکی بەرزەوە هەبوو، بەندەکان بەنێرو مێیانەوە، بەڕووت و قووتی لەوێدا مۆڵ ئەدران و ئەوەستێنران، خەڵك ئەهاتە ئەوێ بەوردی سەیری ئەکردن، هەرکەس هەرکامیان دڵی بیگرتایە ئەیکڕی و ئەی بردەوە، جا دیاریشی ئەکرد نەك گوم ببێ!

ئاواز: دیاری ئەکرد نەك گوم ببێت؟ چۆن؟!

دڵپاك: بەڵێ، بەهۆی مۆرێکەوە کە سوورکراوەبوو ئەنرا بە لەشیا، هەتا ئەوە بێتە نیشانەیەك بۆ ناسینەوەی.

سکالا: ئەی هاوار!! ئەی ویژدانی مرۆڤایەتی لەکوێ بوو؟ هەبوو یان نەبوو، ناهەقم مەگرە کە جنێو بەپێشینان ئەدەم!

دڵپاك: جنێودان پیشەی مرۆڤی دەمپاك و مەرد نییە، خوشە سکالا. ویژدانی مرۆڤایەتی هەر هەبووەو لەجێگەی خۆشیدا جوولاوە، بەلام ویژدان بەتەنها خۆی چی بکات، ئەی نازانی بەبێ باوەڕ ویژدان قابلۆغێکی چۆڵ و خاڵییەوە، چرایەکی بێ نەوتەو ڕۆشنایی لێ پەیدا نابێت؟ ئەی نازانی ویژدان بەتەنها نابێ جێگەی ئومێد بێ و پشتی پێ ببەسترێت؟

سکالا: نەخێر.. نەخێر نەمزانیوە، بەلام خەریکە فێر ئەبم و ئەزانم.

دڵپاك: جگە لەو هەموو ئێش و ئازارو چەرمەسەرییەی کە وەها ئەیچەشت، ئاودەستێکی سادەی خۆش دەست بوو بۆ گشتی، هەرکەسێ کە تەنگاو ئەبوو، ئەچووە لای و خۆی تێدا خاڵی ئەکردەوە، تەنانەت لەهەندێ شوێندا ئەدرا بەکرێ لەڕووی شەرواڵ پیسییەوە پارەیان پێ پەیدا ئەکرد، نازانم چۆن لەڕوویان ئەهات کە داوای گۆرانی وتن و سەماو سووڕدانی لێ بکەن؟! بە چ ڕوویەکەوە داوای ئەوەیان لێ ئەکرد؟[1]

پیتاکێك بووی سووك و ئاسان بەدەس بازرگانانەوە
دەساو دەسیان پێ ئەکردی لەم یانە بۆ ئەویانەوە
لەم بازاڕا بۆ ئەو بازاڕو لەم ولات بۆ ئەوی دیکە
بەبێ هەست و خواستی خۆت بەنرخێکی هەرزانەوە
بەندەیەکی ماف زەوت کراو، کەنیزەکێکی خزمەتکار
لەبازاڕا قنج، ڕووت و قووت مۆڵیان ئەدان، ئەهات کڕیار
سەربەستانە سەیری ئەکرد، کامیان دڵی بیگرتایە
وەکو ولاغ ئەیدایە بەر، بۆ ژنی ماڵ، بۆ کەری بار[2]

سکالا: خوا ئەکا ئەمجارە سەربەست و هەڵکەوت و هاوڕێکانیان دائەنیشن و دەست ئەکەنەوە بە قسە زلەکانیان و باسی ئافرەت و ماف ئەکەن، ئەوسا ئەزانم چۆن وەلامیان ئەدەمەوە، ئەزانم چۆن لە زمانیان بخەم.

دڵپاك: ئەترسم بەهۆی زاڵبوونی هەڵچوونەوە بە سەرتا هەموو شتێکت لە بیرم بچێتەوە! توندوتیژی لەدروستکردنی باوەڕدا بەرهەمی نابێت، خۆ ئەگەر هەشی بێت کاتیی یان کاڵ و کرچ ئەبێت، بەلام ئەگەر هێمن و لەسەرخۆ بێت، لەوانەیە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، داوات لێ ئەکەم کە هێمن بیت، مۆڵەت نەدەیت بەهەڵچوون، هەتا سەرت لێ نەشێوێنێ.

---

[1] سەرچاوە بۆ ئەو باسە یەکجار زۆرە بۆ نموونە: ماذا خسر العالم/ الندوي، الحجاب، للمودودی، الاسلام والرم: ابراهیم النعمة.. هتد.

[2] سروەی بێداری: بێدار.

# بەشی چوارەم

## خۆر نەك چەند مۆمێك

ئاواز: بەپێی ئەوەی کە تۆ باست کرد، ئەم سەرزەوییە، هیچ پیاوچاك‌و چاکەخوازێکی لەسەر نەبووە، هیچ ڕێگەیەکی خێر نەبووە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە ژیان خۆی لەخۆیا تاڵە، ستەم‌و تاوان بەشێکن لەبوون‌و ژیان.

سکاڵا: بەڵام چەندان ئافرەتیش مێژوو وەها باسیان ئەکات کە لێزان‌و تەنانەت سەرکردایەتییان گرتۆتە دەست، بۆ نموونە: کلیۆپاترا، سەمیر ئەمیس، زنوبیا کە شاژنی "تەدمور" بووە.. هتد. ئەی ئەمەیان لەچی؟

دڵپاك: ئێوە وا دیارە بەتەواوی لەمەبەستی من تێ نەگەیشتوون، یان خۆتان تێ نەگەیشتوون یان ئەتانەوێ باسەکە خوارو خێچ بکەن، ئەگەر مەبەستیشتان پرسیارکردن بوو، پرسیارکردن وەها نابێت.

ئاواز: مەبەستمان پرسیار کردن بوو نەك شتێکی تر.

دڵپاك: دەی خوشکە گیان، من نەمگوت‌و ناشڵێم کە سەرزەویی چۆڵ بووە لەپیاوچاك‌و پاك‌و خێرخواز، بەپێچەوانەوە. سەرزەویی قەت مەردی خێرخوازی لێ نەبڕاوە، هەروەها خوای گەورە سەرزەویی لەبیر نەچووە، لەبەر ئەوە بەپێی پێویست پێغەمبەرێك یان چەند پێغەمبەرێکی ناردووە بۆ ئەوەی دەستی خەڵك بگرن‌و بیانخەنە سەر ڕێگەی ڕاست. زۆربەی ئەو پێغەمبەرانە، ئێستا مێژوونووسە بێباوەڕەکان بە چاکساز "المصلح" ناویان ئەبەن، بەشێکی زۆریشیان لە کارەکانیاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، بەڵام خەڵك پاش لەجیهان دەرچوونی ئەوان، ڕێی ڕاستییان گوم کردۆتەوەو ورده ورده چوونەتەوە ناو لیتەی کوفرو نەزانیی‌و نەفامیی.

ئەبێ ئەوەش بزانین، زۆربەی ئەو پێغەمبەرانە هەریەکەیان بۆ نەتەوەیەك یان ناوچەیەکی تایبەتیی نێردراوە، واتە کایەی کارەکەی سنووردار بووە، گشتیی نەبوو کاتیی بووەو بۆ هەمیشە نەبووە، زۆریش لەو پێغەمبەرانە، پێش ئەوەی بانگەوازەکانیان بەخەڵك ڕابگەیەنن‌و بگەنە پلەی سەرکەوتن لەلایەن ملهوڕو دەسەڵاتداران‌و ستەمکارانەوە شەهید کراون.

ژیران‌و پیاوچاکانیش هەوڵ‌و کۆشش‌و ڕەنجیان بۆ بەختیاریی‌و کامەرانیی مرۆڤ داوە، لەچەندان لاوە شۆڕشیان لەدژی ئەو واقیعە نالەبارە کردووە، بەڵام بەزۆریی سەرکەوتن بەدەست نەهێنراوە، چونکە خراپەکاریی زۆر فراوان، بەرەڵڵا، جێگرتوو، قووڵ‌و ڕیشەدار بووە، ئەی باسەکەی "دیوجین"تان لەبیر چووە؟ ئەی بێئاگان لەسەر چی بوو کە "مانی"یان کوشت، نموونە زۆرەو لەژمارە نایەن.

بەڵام ئەگەر بەتێکڕا بڕوانینە مێژوو، وەك شەوێکی تاریکی شەوانی وەرزی زستان وەهایە، بەتایبەتیی سەبارەت بەئافرەت، جا لە شەوێکی وەهادا، لە بیابانێکی فراوانی بەر بەرەڵڵادا، ئەگەر بەسەدەها مۆم دابگیرسێت ئایا ئەو بیابانەیان پێ ڕۆشن ئەبێتەوە؟

سکاڵا: نەخێر.. نەخێر، بێگومان ملیۆنەها مۆمیش ڕۆشنی ناکەنەوە.

دڵپاك: کەواتە ڕۆشنکردنەوەی ئەو بیابانە پێویستی بەڕۆژبوونەوە، بە هەڵهاتنی خۆر هەیە، هیوادارم لەمەبەستم تێبگەن.

بەلأم، ئایا ئەتانەویٰ بەدرێژایی مێژوو، شەش، حەوت ئافرەت هەڵنەکەویٰ؟ ئەوانە ئایا بە پەنجەی دەست ناژمێرێن لەکاتێکا هەزارەها پیاو هەڵکەوتوو ناوی خۆی خستۆتە مێژووەوە؟ ئەو چەند ئافرەتە لەچاو ئەو هەموو پیاوەدا پێم بڵێن چ نرخێکیان هەیە؟

## دەرمانی دەردەکە بەوە نەکراوە

سکالأ: لەباسەکانتاندا وا دەرئەکەوێت، کە لەهەندێ وڵاتدا، لە هەندێ کاتدا ئافرەت پلەو جۆرە سەربەستییەکی هەبوو، وانییە دڵپاك؟

دڵپاك: بەڵێ وابووە. بەلأم ئەو پلەو سەربەستییە تەسكو تروسكو کاتییو دانەمەزراوو بووە، بەداڕشتنێکی تر تینوویەتیی ئافرەتی نەشکاندووە، سەنراو نەبووەو دراو بووە، لەوەش زیاتر پێچەوانەی فیترەتی ئافرەت بووە.

بەڵێ خوشکەکانم، ئەو پلەو سەربەستییەی کە لەو کاتو شوێنانەدا بەئافرەت دراون، سەرچاوەکەیان تەنها سۆز بووە، سۆز بەهەردوو لایەنەکەیەوە چاكو خراپ، ئافرەت خۆشەویست بوو بەلای منداڵەکانیەوە، بەلأم ئەو خۆشەویستییە هی دایکیەتیی بوو کە زیندەوەرەکانی تریش لەو سۆزەدا لەگەڵ مرۆڤدا بەشدارن، ئەی نابینن جووجەڵە، تووتکە سەگ.. هتد. چۆن ڕا ئەکەن بەدوای دایکیاندا؟ چەند بەزەحمەت لەسەردەمی بچووکییدا لەدایکیان دوور ئەخرێنەوە یان جیا ئەکرێنەوە؟ دیارە ئەوە سۆزە لە بەچکەوە بۆ دایك، دایکیش هەمان سۆز بگرە بەگوڕتر ئەو سۆزە ئەنوێنێ بۆ بێچووەکانی خۆی، ئایا نەتان دیوە چۆن مریشك ئەنیشێت بەسەرو گوێی ئەو کەسەوە کە دەس بۆ جووجەڵەکانی ئەبات؟

بەڵێ، جۆرە بایەخێك لە هەندێ سەدەی پێشکەوتندا، لەشارستانیەتە گەورەکاندا بەئافرەت ئەدرا، بەلأم بەهۆی ئەوەوە نەبوو کە بەدەم هاواری تاساوی ئافرەتەوە چووبن، ددانیان بەمافی ڕەوای ئافرەتدا نابێ، ئەو کەسانەی کە وەها بۆی دائەچن بە هەڵەدا چوونو لەڕاستییەوە گەلێ دوورن، چونکە ئەو بایەخ پێدانە لەسەرچاوەو شتێکی ترەوە هاتووە، بەزەقتر بڵێین، لەپێناوی ڕابواردنو بەرژەوەندییو تێرکردنی ئارەزووە ئاژەڵییەکانی پیاودا بووە، لە جێبەجێکردنی تاسەو هەوەسو حەزی پیاو بەولاوە تێنەپەڕیوەو نەچووەتە دەرەوە.

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، بەڵگەت چییە لەسەر ڕاستیی ئەو باسەت؟

دڵپاك: بەڵگەم لەسەر ڕاستیی باسەکەم، گەواهیی مێژووە، خۆ ئەگەر تەماشای سەرچاوە مێژوو‌ییەکان بکەین، ئەبینین کە ئەو پلەو نرخو سەربەتسییە بەشێوەیەکی بڕیار لەسەردراوو یاسایی یان ئایینی نەبووە، لەهەستو ئاوەزێکی قووڵی کۆمەڵایەتییەوە یان یاساییەوە هەڵ نەقوڵاوە، لەئەنجامی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەوە نەهاتووە، ئەمە لەلایەکەوە.

لەلایەکی ترەوە، هەر لەو کاتو شوێنانەدا ئافرەتە بەندەکان، تیاترۆکان، کەنیزەکەکان، داوێن پیسو بەدڕەوشتەکان، پلەو نرخو ڕێزو باوو ڕەواجیان لەناو کۆمەڵگەو شوێنە گشتییەکاندا، تەنانەت لەکۆشکەکاندا لەهی ئافرەتە . بەناو . ئازادەکان هیچی کەمتر نەبووە.

چاوەکەم، دەردەکە زۆر لەوە گەورەتر بووە کە بەچەندان ئافرەتێك، یاخود بەسوکەڵە سەربەستییەك لە کاتێکی دیاریکراودا قەرەبوو بکرێتەوە.

گیروگرفتەکە زۆر لەوە فراوانتر بووە کە لەچەند شوێنێکا یا لەچەند کاتێکدا بە جۆرە سەربەستییەكو سەربەخۆییەك بتوانن پینەو پەڕۆی بکەن، فەرموون خۆتان بیری لێ بکەنەو، فلأن ئافرەت مادام خوشکی یان ژنی یان دایکی فیسار سەرۆك، یان دەسەلأتدارەو ئەبێ ڕێزی بگیرێتو سەربەستو ئازاد بێت، ئەوە کەی توانیویەتی ببێت بە دەرمانێو بتوانێ چارەسەری دەردی ئافرەت بکات؟ میکرۆبێ دەردەکە قەلأچۆ بکاتو ئۆخەی بخاتە دڵی ئافرەتەوە؟

# بزرکردنی مرۆڤایەتی ئافرەت

سکالاّ: جاران بە پەرۆشەوە ڕۆژانم ئەژمارد دڵپاك، خوا خوای ئەوەم بوو زوو هەینیی بێتە پێشەوەو بڕۆینەوە بۆ شار، کەچی دوێنێ لەماڵەوە، کە لەناو کەسوکاردا بووم، دۆستو هاوڕێیانم لەگەڵدا بوو، خۆمم بە غەریب ئەزانی، وەك جاران نەبووم، دەنگت لەگوێمدا هەر ئەزرنگایەوە، بیرم بەلای تۆوە بوو، لەوەدا دەستی خۆم نەبووم، ئاواتم ئەوەبوو زوو بگەینەوە بەیەك، ڕەنگە تۆ وەها نەبیت بۆ من دڵپاك؟

دڵپاك: من نەك تۆ بەتەنها، تۆو ئاواز، هەردووکتانم خۆش ئەوێ، ئێوە منتان خۆش بوێ یان نا، من ئێوەم هەر خۆش ئەوێ، چونکە ئێوە پاکن، حەز لە ڕاستی ئەکەن، بەڵام لێیان بزر کردوون، زۆری ئەوێ تا بیدۆزنەوە.

هەروەها من موسڵمانم، ئاینەکەم داوام لێئەکات کە بەزەییم بەخەڵکا بێتەوە، سۆزو نەرمیی بەرامبەر ئادەمیزادەکان بنوێنم، ئەها چەند بە پەرۆشەوە داوام لێ ئەکردن کە یەکتر بناسینو لەیەکتر تێبگەین.

ئاواز: خۆشەویستت نەمرێ، سوپاسی هەستی ناسکت ئەکەم.

سکالاّ: تۆ باسی ژیانو گوزەرانی ئافرەتت لەپێش دەرکەوتنی ئیسلامدا بۆ کردین، لەوەوە فێربووم کە ئافرەت چەوساوەو ستەملێکراوو دەستبەسەرو کۆتو زنجیکراوو بەشخوراوو بووە، مەرگی لەزیندەگیی چاکتر بووە، بەلاّم ئەی پێم ناڵێیت بنەڕەتی ئەوە چیبووەو بۆ چی وابووە؟

ئاواز: بەبیروڕای من بنەڕەتی ئەو هەمووە دواکەوتنو نەزانیی بووە.

دڵپاك: سەیرە! مامۆستا ئاواز، ئەمە چەند جارێ ئەم بیروڕایەتت گوتەوە، لەکاتێکدا وەها نییە کە تۆ فەرمووت. بەواتایەکی تر پێشکەوتنو زانین خۆیان بەتەنیا لەسەدا شەستیش ناتوانن مرۆڤ بگۆڕن، بەختیاریی بۆ مرۆڤایەتیی بهێننەوە دەس، ئەوانە هۆی یارمەتیی دەرن نەك هەموو شتێ.

ئاواز: باشە دڵپاك، ئەی تۆ چۆن ئەڕوانیتە مەسەلەکە؟

دڵپاك: ڕوانینی من؟ نا.. نا، با بگەڕێینەوە بۆ لای مێژوو، ئەو باسەکەمان ئەدات بەدەستەوە، کە باسەکەش هۆیەکانی ئەو مەسەلەیەمان بەمجۆرە بۆ باسو دیاری ئەکات:

کۆمەڵگەو گەلو شارستانییەتەکانی پێش ـ جگە لە ئاینە پاکەکان ـ وایان لەپیاوان گەیاندبوو کە ئافرەت جۆرە گیانداریکی ترە. بەدارشتنێکی تر بەقووڵی نەیان ئەزانیی کە ئافرەت مرۆڤەو لە مرۆڤایەتیدا هیچی لەپیاو کەمتر نییە، نەیان ئەزانی کە گیانی پیاوو ئافرەت یەك گیانە، تەنانەت بلیمەتانو فەیلەسووفە بەرزەکان بیروڕای سەیرو ناوازە "شاذ"یان لەوڕووەوە هەبوو، ئەیان پرسی: "ئەرێ ئافرەت گیانی هەیە یان بێگیان (ڕوح)ە؟ ئەگەر هەیبێت ئاخۆ ئەو گیانە مرۆڤانە یاخود ئاژەڵانە بێت؟ گریمان گیانەکەی مرۆڤانەیە، ئەی گوزەرانی کۆمەلاّیەتیو "مرۆڤانە"ی لەچاو پیاودا ئەبێ چۆن بێت؟ گوزەرانی بەندە یا کەمێك لە بەندە بەرزترە؟".

زۆربەی پیاوان باوەڕیان وەهابوو کە ئافرەت شیاوی باوەڕداریی نییە، کەڵکی کارچاکیی پێوە نییە، شیاوی خواپەرستی نییە. تەنانەت ئەو دانە دانەیان کە گەیشتوونەتە پلەیەکی ئەوتۆی کۆمەلاّیەتیی، لەو شوێنانەدا کە باسمان کردن، لەبەرچاوی کاڵی ڕەگەزی ئافرەت نەبووە، واتە داننان نەبووە بەمافی ڕەوای ئافرەتدا، بەڵکو سیفەتە کەسایەتییەکانی ئەو ئافرەتانە بەزۆر خۆیان سەپاندووە، وەك بڵێین ئارایشن بۆ ناو مەجلیس، یاخود ئامرازێکی ڕابواردنو دەوڵەمەندەکان بێئەوان نایانکرێت. بەلاّم بەناوی ئەوەوە کە ڕەگەزی ئافرەت شیاوی ئەو پلەیەیە، ئەوەیان بەهیچ کلۆجێك نا.

یەکسانی لەنێوان کوڕو کچ، ژنو مێرددا لەچوارچێوەی خێزاندا نەبووە، لەڕووی یاساوە کەسایەتییو لەڕووی ئابوورییەوە شیاویی لێ زەوت کراوە، سیفەتە سروشتییەکانی خۆی لێشاررابۆوە.

ئێستاش ئەتوانین هەموو باسەکە لەم ڕستانەدا کۆبکەینەوەو بڵێین: مرۆڤایەتی ئافرەت بزر کرابوو، شارابۆوە، بوو بوو بەژێر پێوە، نەئەناسرا، ئافرەت لەمرۆڤایەتیی ئاوەڕووت کرابوو.

سکالاَ: من سەرم لەوە سوڕ ئەمێنێ، چۆن بیریان نەکردۆتەوە کە لەئافرەت بوون! هەموو ئەو ستەمکارانەی کە وایان کردووە خۆ لەئافرەت کەوتوونەتەوە.

دڵپاك: بیرکردنەوەو قسەکانی تۆ ڕاستن، بەڵام ئەی بۆچی سەرت لە پیاوانی ئێستا سووڕنامێنێ؟ ئەی بۆچی سەرت لە ئافرەتی خوێندەواری ئەمڕۆ سووڕنامێنێ کە بە هەڵخەڵەتاندن و گومبوون و سەر لێشێواوی خۆی، خۆی بەئازادو بەختیار ئەژمێرێت؟

## گێڕانەوەی مرۆڤایەتی بۆ ئافرەت

سکالاَ: خوشکە دڵپاك، وەك باستکرد مرۆڤایەتیی ئافرەت بزر کرا بوو، بۆیە ئەوەندەش بەدبەخت و کلۆڵ ژیاوە، بەڵام ئەی چارێ، ڕاوێژێ نابێت بیدۆزێتەوە؟ ئایا ڕەوایە هەر وەها بژی؟

دڵپاك: خوشکە گیان، بەڵێ، ئەبێ چارە بدۆزرێتەوە، ئەبێ ئەو مرۆڤایەتییە بزرکراوە بگێڕێتەوە، ئافرەت مرۆڤە، هەزار ئەوەندەی تریش بەدبەخت بکرێت هەر مرۆڤەو لای پەروەردگار بەڕێزە، ئەوە ئێوە بێ ئاگان، خوای گەورە (یمهل ولا یهمل) مۆڵەت ئەدات بەڵام شت ناخاتە پشتگوێ، هەزارەها پلان و ساختەی پڕ لە هونەر ڕێکبخرێت وەك ڕێکخراوە ناتوانن بگەنە ئەوەی کە ئەیانەوێ، ناحەزانی ئافرەت خوا یاربێت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئەناسرێن و پەردەیان لەسەر هەڵ ئەماڵرێ و پلان و ساختەکانیان دەرئەکەوێ و ئافرەتیش ڕێگەی ڕاست ئەدۆزێتەوە.

ئاواز: بەڵام پێت نەگوتین، تۆ ئەو ئاسۆیە لە چیدا بەدی ئەکەی؟

دڵپاك: بێگومان لەو بەرنامەیەدا کە خوا ناردوویەتی بۆ ئادەمیزاد بەهەردوو بەشەکەیەوە. نێرو مێ وە کە پێی ئەڵێن ئیسلام.

ئاواز: بەڵام بەچیدا ئەزانی کە ئیسلام ئەتوانێت ئافرەت ئازاد بکات و لە جەورو ستەم ڕزگاری بکات و مافی زەوتکراوی بۆ بگێڕێتەوە؟

دڵپاك: چاوەکەم من ئەوە بەهۆی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺوە بەهۆی مێژووی ئافرەتی موسڵمانەوە ئەزانم.

لەو کاتەدا کە لە سەرانسەری جیهاندا ئافرەت بەدبەخت و بەشخوراوو ماف زەوتکراو بوو، هیچ نرخ و ڕێزێکی بۆ دانەئەنرا، پشتگوێ خرابوو، تەنانەت نەك خەڵکی سادە بەڵکو زاناو فەیلەسووفەکان نەیانئەزانی ئافرەت بەئادەمیزاد یان ئاژەڵ دابنێن!! ئا لەو کاتەدا پەروەردگار ئایینی ئیسلامیی نارد بۆ دەستگرتن و قوتارکردنی هەموو گێتیی لەجەورو نەزانیی و دڕندایەتیی ستەمکارو نەزان و دڕندەکان.

ئافرەتی بەسەزمانیش کە هەندێ جار بەکوێرانە بەرز ئەکرایەوەو پیاوان ڕێیان پێئەدا کە سەر دەربێنێ، ئەویش تەنها بەمەبەستی سێکس، کە ئیتر بەدرێژایی مێژوو هێنراوەتە خوارەوە بۆ ڕیزی ئاژەڵ، بخوات و بخواتەوە، سکی پڕبێت و مناڵی بێت، گسك بدات، شەوو ڕۆژ نەوەستێ و کار بکات، بەبێ ئەوەی مافی خاوەنداریێتی هەبێت، بەبی ئەوەی هیچ تایبەتمەندییەکی هەبێت، بەناوی ئەوەوە کە "ئەویش نیوەی کۆمەڵە"، بە دەرکەوتنی ئیسلام گوزەران و ژیانی گۆڕا، نەك تەنها ئافرەتی موسڵمان، تەنانەت ئەو ئافرەتانەش کە موسڵمان نەبوون یاخود لەدەرەوەی سنووری وڵاتی ئیسلامدا ئەژیان. بەڕاستیی ئیسلام شۆڕشێك بوو باری ژیانی سەرانسەری خەڵکی گۆڕی و چاوی گێتیی کردەوە.

سکالاَ: بەڵام ئەوەیان چۆن؟ تێناگەم.. تێناگەم!

دڵپاك: بەپێی سەرچاوە جۆربەجۆرەکانی مێژوو ئەتوانین بڵێین: دەرکەوتنی ئیسلام وەك هەڵهاتنی خۆر وەهابوو، ئایا کاتێ کە خۆر هەڵدێت، ڕۆشنایی و گەرمایی نادات بە جیهان؟ هەر تەنها بۆ کۆمەڵێك هەڵدێت؟

سکالاَ: نەخێر، بۆ کۆمەڵێك هەڵنایەت، بۆ جیهان هەڵدێت، تیشك و ڕۆشنایی و گەرماکەی بۆ هەموو جیهانە نەك کۆمەڵێك بەتەنیا.

دڵپاك: خوشكەكانم، بەدەركەوتنی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی، ئافرەتی موسڵمان بەپێی بەرنامەكەی خوا ـ نەك بەسۆزو بەزەیی پیاو ـ مرۆڤایەتیی بزركراوی بۆ گێڕرایەوە، لەگەڵ پیاودا هاوسەنگ بوو، مافی خۆی پێدراو لەبەدبەختیی و كلۆڵییەوە هەوارگەی گواستەوە بۆ بەختەوەریی و شادمانیی، بووە مرۆڤێكی بەڕێزی پایە بڵندو لەژێر پێپێی ئەودا پیاو ئەگەڕا بۆ بەهەشت "الجنة تحت أقدام الأمهات".

جا كە گەلو نەتەوەو میللەتە ناموسڵمانەكانیش هەستیان بەوە كرد، بە ناچاریی بێ یان بە شێوەیەكی تر شێوازو تێڕوانینیشیان گۆڕاو ئافرەتان چاویان كردەوە، بەشێك لەمرۆڤایەتیی بزركراوی گێڕرایەوە بۆ خۆی یان بۆی گێڕرایەوە.

ئاواز: خوشكە دڵپاك، ئەوەی كە گوتت ڕاستەو زۆر باش باوەڕی پێئەكەم.

دڵپاك: بەڵام خوشكەكانم، لەسەرەتاوە ئەتانگوت ئیسلام هۆی بەدبەختیی و كلۆڵی ئافرەتەو بە سەرەتای كلۆڵیی و بەدبەختیی ئافرەت دەژمێررێت!

سكالا: ئۆهۆوو..!! بێ بەلابی دڵپاك، شتت هەر لەبیر ناچێتەوە! ئێمە ئەم بەسەرهاتو ڕووداوانەمان نەبیستووە.

دڵپاك: دەی ئەگەر لێم زیز نەبن ئەڵێم ئیسلام بەدەركەوتنی، سەرەتای گێڕانەوەی مرۆڤایەتیی ئافرەت بوو.

## كە خۆری ئیسلام هەڵهات ئافرەت ناسرا

ئاواز: تۆ گوتت، بەدەركەوتنی ئیسلام ژیانی ئافرەت گۆڕا، لەسەر قسەكەشت گەلێ سوور بوویت، پێمان ناڵێیت چۆنی گۆڕی؟

دڵپاك: بۆ پێتان ناڵێم! ئەوە شتێك نییە كە بشاردرێتەوە.

سروشتی ئایینی خوا ـ ئیسلام ـ وەهایە، لەسەرەتاوە باوەڕ لەناخی ئادەمیزاددا بەشێوەیەكی پتەوو كاریگەر دائەمەزرێنێ، كە ئەوە هاتە دی، لەبەر ڕۆشنایی ئەو باوەڕەوە وردە وردە هەنگاو هەڵئەگرێت، بەڵێ، پاش دامەزراندنی ئەو باوەڕە پاكە، ئیسلام بەیاسا نایابە بێگەردو بێوێنەكانیەوە ڕووی كردە هەموو لایەنەكانی ژیان، ژیان بەهەموو واتاكانیەوە، ئەمجا هەموو هەڵسوكەوتو گوفتارو وتارێكی ئەم ژیانەی بەست بەژیانێكی تری نەبڕاوەوە، بەڵكو ئەمی كردە كێڵگەی ئەو ژیانە بێكۆتایە، كە ژیانی دواییە.

خوای گەورەی بەدیهێنەری بوونو ژیان، ئەیزانی كە بیابانی تاریكی ژیان بەچەند مۆمێكی ئەم لاو ئەولا ڕۆشن نابێتەوەو پێویستیی بە خۆرێكی ڕۆشنكەرەوەی تیشك هاوێژ هەیە، لەبەر ئەوە خۆری ئایینی ئیسلام هەڵهاتو هەموو كونو قوژبنێكی ئەو بیابانە تاریكەی ڕۆشنكردەوە، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان بەنێرو مێیانەوە ڕێگای ڕۆیشتن بەدی بكەنو سەریان لێ نەشێوێت.

یەكێك لەتایبەتمەندییەكانی ئەو ئایینە گشتگیرییە (الشمولیة)، واتە بۆ هەموو كاتو شوێنو ئادەمیزادێكە، چ نێر چ مێ، بەبێ جیاوازیی، دیارە ئەوەش شتێكی ئاسایی و سروشتییە بۆ ڕێبازێ كە لەدانانی پەروەردگار بێت، قابیلە وەك یاسا زەمینەكان بێتو بەتەنها بەرژەوەندی بەشێك یان دەستەیەك یاخود گەلێك ڕەچاو بكاتو ئەوانی تر فەرامۆش بكات؟ كێ لە خالقی ئادەمیزا زیاترە زانایە بەدڵو مێشكو هەستو نەستو گیانو دەروونی ئادەمیزاد؟ كێ هەیە وەك پەروەردگار شارەزابێت بەهەوەسو تاسەو ئاواتو ئارەزووە زۆرو زەبەندەكانی ئادەمیزاد؟

بەڵێ، خۆری ئیسلام هەڵهات، تیشكی هاویشت بۆ هەموو شوێنەكانی سەرزەوی بۆ تێكڕای ئادەمیزاد بەبێ جیاوازیی، بەبێئەوەی هیچ جیاوازییەك بگرێتە خۆی سەبارەت بە نێرو مێ و هەستو ئارەزووەكانیان، هەریەكەیانی بەئەسپایی لەشوێنی گونجاوو شیاوی خۆیدا دانا، بەو پێیە ئافرەتیش كە بەشێكە لەدوو بەشی مرۆڤایەتیی بەر ئەو تیشكە كەوت، تاریكیی بەسەرەوە نەماو ناسرا، بەڵێ ناسرا كە مرۆڤە نەك شتێكی تر، مرۆڤەو خاوەن گیانیشە، گیانەكەشی هەر هەمان گیانە كە پیاویش هەیەتی، بەدارشتنێكی تر گیانیان یەك گیانە، لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاوە، ئەمەش خۆی لەژمارەیەكی

زۆری یاساکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺئەنوێنێو لەو ڕۆژگارانەدا کە حوکم حوکمی قورئان بووە جێبەجێکراوە بەواقیعیی نەك بەزار، فەرموون گوێ بگرن لەم یاسا قورئانییە وەك نموونەیەك: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً)[1].

هەروەها پێغەمبەری ئیسلام ﷺ

لەم ڕووەوە ئەفەرموێ: "كلكم من آدم وآدم من تراب"[2].

سکالاّ: ئێ.. ئێ! جا تۆ ئەوەت ئەزانی بۆچی زوو نەتئەگوت خاتوو دڵپاك؟ ئەوە لەکوێدا ئەوانە نووسراون؟!

دڵپاك: یەکەمیان لە قورئانداو دووەمیان لە پەڕاوەکانی "حديث"دا، ئەی نازانی یەکەمیان بەشێکە لە سوورەتێك بەناوی سوورەتی ئافرەت، خوا ناوی بردووە، (سورة النساء)! کەچی لەقورئاندا سوورەتێك نییە بەناوی (سورة الرجال)، کە هەق هەیە ئافرەتان هەر بەوە باش بزانن کە ئافرەت لەئیسلامدا بەرزو خاوەن پلەو بەڕێزە، خاوەن شکۆو پایەدارەو ئەبێ خۆی بناسێتو ئەو هەمووە بەفیڕۆ نەدات، ئافرەتێتیی خۆی بپارێزێت، بەڕاستی جێی داخە ئافرەت خۆی نەناسێت!

چۆن ئەکرا من لە سەرەتاوە ئەمەتان پی بڵێم لەکاتێکدا ئێوە سەرەتای کڵۆڵییو بەدبەختیی ئافرەتتان بەناهەق ئالاّندبووە گەردنی ئیسلام! وام بەچاك زانی کە وردە وردە هەنگاو هەڵگرینو لەئیسلام نزیك ببینەوە.

ئابەو جۆرە پڕ لەجەورە سەدان سەدەو چەرخ ئەژیا ن
خوشکەکانم، ئەو شۆڕشەی مافی سەربەستیی بۆ هێنان
نەکەن هەرگیز بەرامبەری بەدنمەك بن، ئالاّکەی جوان بەرزکەنەوە
با یەکسانیی، با ئازادیی، باش بپۆشێت بووکی ژیان[3].

## ئافرەتو پیاو لەیەك سەرچاوەوە هاتوون

ئاواز: دڵپاك خان، بەڵێ بەهەڵهاتنی خۆری ئیسلام ئافرەت ناسرا، بەلاّم ئەو ناسراوییە ئایا هیچ شتێکیی ئەوتۆی بەدەمەوە بوو؟

دڵپاك: ئا لەو کاتە سەیرو سامناکانەدا کە باسمان کردن، وەك ئەزانین لەنیوە دوورگەیەکی وشکی کەم بارانی بێ ڕووباردا، لەنیوە دوورگەیەکی بێ زاناو فەیلەسوفدا، نیوە دورگەی عەرەب، لەناو بیابانێکی لماویی کەم دەرامەتدا، لەناو نەتەوەیەکی دواکەوتووی یەك نەگرتووی پەرتەوازەی دووبەرەکیی و خێڵ بازیی و هێرشکردنە سەر یەکتردا خۆری ئیسلا م هەڵهات. ئایا ئەوە خۆی لە خۆیدا موعجیزە نەبوو؟ چۆن شتی ئەوتۆی بەدەمەوە نابێت؟!

سکالاّ: دەی.. دەی، دڵپاك گیان، لەسەر باسەکە بڕۆ، بەشکو بگەینە چارەیەك بۆ دەردەکانی ئافرەت، ئاخ پیاوی دڵڕەقی ستەمکار!

دڵپاك: نا.. نا، چۆن دڵت دێت؟ دڵیان مەشکێنە، ئەوان لەخۆشەویستی ئێمەدا هەمیشە زیتەی چاویان دێت!

هەڵهاتنی خۆری ئیسلام، گەورەترین شۆڕشی سەر زەویی بوو، گۆڕانێکی گەورەی بێوێنەی لەهەموو سەرێکەوە هێنایەکایەوە، ئەو گۆڕانە ژیانی ئافرەتیشی بەتەواویی گۆڕی، بەپێی ئەو گۆڕانە شیاویی ئافرەت سەلمێنراو چەسپێنرا، شیاویی: پەرستش، فێربوونو فێرکردن، ئابووریی، کۆمەلاّیەتی، تەنانەت ڕامیاریش.

شیاویەکی وەها کە هیچی لەهی پیاو کەمتر نەبێت، مافو ئەرکی سەر شانی لەهی پیاو کەمتر نەبێت، تەنانەت چاوەڕوانییو هیوای ئەوەی لێبکرێتو پێی بسپێررێت کە لە چاککردنی بارودۆخی ژیانی کۆمەڵگەدا دەوری سەرەکیی

---

[1] سوره النساء، ئایەتی (١).

[2] رواه مسلم.

[3] سرووەی بێداری.

ببینێت! ئەها پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ٧١).

ئەمەش جگە لەوەی کە ئیسلام لەڕووی مرۆڤایەتیەوە ئافرەتو پیاوی یەکسان کرد، لەعنەتی تاوانی لە بەهشتا دەرکردنی لێ دوورخستەوە، زیندەبەچاڵکردنی یاساغ کرد، پەستبوونی بە لەدایکبوونی کچ بەتاوانێکی گەورە ناو برد، فەرمانیدا بەڕێزگرتنی چ کچ بێ یان ژن یان دایك، کردی بەخاوەنی میرات، مافو ئەرکی لەسەرشان سەبارەت بە هاوسەرەکەی دیاریکرد، کاروباری تەلاقی بۆ ڕۆشنکردەوە، سنووری چەند ژنێتیی "تعدد الزوجات"ی دیار کرد، پێش باڵغ بوونی خرایە ژێر پەروەردەکردنو پێگەیاندنی چاكو پاکی کەسوکاری، ئایا ئەم هەمووە هیچ نەبووە؟ بەشتێکی ئەوتۆ ناو نەبرێت؟!

ئاواز: ناتوانم بڵێم نا، چۆن پشت لەڕاستی بکەم؟

دڵپاك: ئیسلام بڕیاری ئەو بنەڕەتەی لەسەر حەقیقەتی وەسپێکی گشتی داوە، ئەو وەسپەی کە ئافرەتو پیاو تێیدا وەك یەك بەشدارن، ئەو وەسپەی کە لەدوو ڕەگەزی سەرەکیی بەناو یەکچوودا پێکهاتووەو بەهەردووکیانەوە یەك حەقیقەت پێك ئەهێنن کە وەسپە گشتیەکەیە، ئەو دوو ڕەگەزەش ئەمانەن:

برایەتیی ڕەگەزی مرۆڤایەتییو یەکیەتیی واتای مرۆڤایەتیی، بە واتا، مرۆڤایەتیی کردنە یەك.

ئافرەت لە هەردووکیاندا یەکسانە لەگەڵ پیاودا، یەکسانییەکی تەواو، بەو پێیە ئافرەت خوشکی پیاوە، چونکە هەردووکیان لەیەك باوكو لەیەك دایك کەوتوونەتەوە کە "ئادەم"و "حەوا"یە.

ئەها خوای گەورە چۆن بانگیان لێ ئەکات: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات: ١٣). هەموویان لەوشەی "الناس"دا کۆ ئەکاتەوە، بەنێرو مێیانەوە، تیایا نیشانی ئەدات کە سەرچاوەی خەلق بوونیان یەکێکە، خالقیان یەکێکە، لەیەك جۆرن، کەجۆری "الناس"ە، لەوەش زیاترو بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "النساء شقائق الرجال"، واتە ئافرەتان بەشێك یان پارچەیەکن لەپیاو، بەواتایەکی تر خوشکانی پیاوانن.

دیارە برایەتی ڕەگەز پێویستی بەیەکسانی هەیە، چونکە دوو برا لەبەر چاوی باوکەکەیاندا یەکسانو هیچ کام لەوی تر بەشی زیاتر نابێت بەپێی ئیسلام، هەر بەو جۆرەش ئافرەت لەگەڵ پیاودا یەکسانە.

هەروەها ئافرەت لەئیسلامدا مرۆڤە وەك پیاو، لەمرۆڤایەتییدا یەکسانن، ئەمەش نەك بەدەمی من، بەڵکو بەپێی یاساکانی خوا ئەها ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ (النساء: ١).

جا هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد، خوای پەروەردگار بانگەوازەکەی ئاراستەی هەردوو لا بە وشەی "الناس" ئەکات، ئەها وەك یەك لەخواترسانیان لەلایەن خواوە لێداوا ئەکرێت، جا نازانم ئێوە بە باشیی لەمەبەستەکە تێ ئەگەن؟

سکالا: بەڵێ.. بەڵێ، مەبەستەکە بەجوانیی ڕوونو ئاشکرایە.

دڵپاك: هەروەها دیمان کە ئاگاداریان ئەکات بەوەی کە لەنێرو مێ خەلقی کردوون، لەخواترسانەکە پەیوەندیی بە تایبەتمەندیی "خصائص"ی گیانییەوە هەیە، بانگەوازەکەیان لەڕووی تایبەتمەندێتیی مرۆڤایەتیەوە ئاراستە کراوە، ئەو تایبەتمەندێتییە ئەیانکات بەجۆرێکی سەربەخۆی جیا لەنێوان جۆرەکانی تری گیاندارانداا کە زۆر جۆریان هەیە. بە هۆی ئەوەوە کە ئافرەت ئەچێتە تێگەیشتنی "مفهوم"ی وشەی "الناس"ەوە، بێگومان لەڕووی ئەرکی لەخواترسانەوە ئافرەتیش دوێنراوە بەیەکسانیی وەك پیاو، واتە یەك مرۆڤن، لەمە زیاتر ئافرەت بۆ کوێ بەرز بکرێتەوە؟

لەڕستەی ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾دا، نیشاندانی دانە پاڵ یەکتری گیانیی دیارترو چەسپاوترە لەنیشاندانی برایەتی لەڕەگەزی هەستییدا کە ئەبێ لەدوو گیاندا هەبێت نەك "یەك گیان"، ئەبێ ئەوەش بزانین وشەی دەروون "النفس" مەبەستی گیان (ڕوح)ەو مەبەستی لە سیفاتی مەعنەویی ئادەمیزادە.

لەڕستەی "وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا"یشدا، لەگەڵ ئەوانی پێشوودا بنجبەستی نیشاندانی یەكێتیی (وحدة)ی مانای مرۆڤایەتیی ئەكات، چونكە ڕستەی یەكەم نێرو مێ ئەگرێتەوە بۆ یەك گیان كە ئادەمە، ڕستەی "وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا" بڕیاری خەلقبوونی ئەو ژنەی تێدا دراوە كە دایكی هەمووانە "حەوا" لەهەمان سەرچاوەی گیانیی، ئایا لێم تێگەیشتن؟

سكاڵا: زۆرباش تێگەیشتم، ئەوەم بۆ ساغ بۆوە كە نێرو مێ لەمرۆڤایەتیدا زادەی یەك سكن، میوەی یەك لقن، هەویری یەك ئاردن، دوو لایەنی ڕەسەنی یەك حەقیقەتن كە مرۆڤە یاخو مرۆڤایەتیە. ئەو دوو لایەنە یەكسانن، وەك یەك مافی ژیانیان هەیە، وەك یەك شیاوی خواپەرستییو ئاینداریی و ساماندارییو مافداریی كۆمەڵایەتییان هەیە، ڕۆڵو ئەركیان لەژیاندا وەك یەكە، هەرچی ستەمێك پێش ئیسلام لەئافرەت كراوە، بەهۆی نەزانییو بێبەرنامەییو بێیاساییەوە بووە.

دڵپاك: زۆر سوپاسی خوا ئەكەم كە یارمەتی دایتو توانات پەیداكرد كە حوكم بەسەر ڕاستییو چەوتیی گیروگرفتدا بدەیت، ئێستا ڕات چییە بەرامبەر ئەم قسەیە: "ئیشی سەرەكی ئیسلام چەوساندنەوەو كۆتكردنی ئافرەت بوو.. سەرەتای نەگبەتیو بەدبەختییو سەرسەختیی ئافرەت بەدەركەوتنی ئایینی ئیسلام دەستیپێكرد"

سكاڵا: ئۆی دڵپاك!! هەرگیز شتت لەبیر ناچێتەوە، درۆیە، بوختانە. ئەوانەی ئەوە بڵێن، درۆزن و بۆختانكەرن، من لە نەزانییدا ئەوەم ئەگوت، بەدەم خەڵكەوە ئەم بیست، وام ئەزانی خەڵك زاناو دڵسۆزە.

ئاواز: دڵپاك، خەڵك وا ئەڵێت، ئێمەش لە خەڵكەوە فێری ئەو قسانە بووین.

دڵپاك: بەڵێ، ڕاست ئەكەن، ئەو دەردە هەر بەتەنها ئێوەی نەگرتۆتەوە، زۆربەی پڕوپاگەندەكانی ئەمڕۆی دژی ئیسلام وەهانو پشت بە بیستن ئەبەستن، هەرچی ئەبیستن وەك تووتی ئەیڵێنەوە.

هەرچی ئەبیستن بڕوای پێ ئەكەین
هەركە دیار بێت پەنای بۆ ئەبەین
لەكوێدا ڕێككەوت باری لێ ئەخەین
چیمان دەرخوارد دەن گورج قووتی ئەدەین
هەرچیمان فێركەن منەت بەگیانە
هەر فەرمانی كەن بەڵێو قوربانە
ئەوەندە بیرو حاڵمان وێرانە
ژاری كوشندە لامان دەرمانە[1].

ئاواز: ئەوە شتێكی ڕاستە، چونكە بەجێماوین، دواكەوتووین.

دڵپاك: بەڵام ئادەمیزاد كە برسیی بێت، ئەگونجێت هەرچی دەرخوارد بدەن یەكسەر بێ جووین قووتی بدات.

## چۆن ئیسلام بناسین

ئاواز: خوشكە دڵپاك، لەوانەیە تۆ بەهەڵە لەئێمە گەیشتبیت، قابیلە ئێمە كافر بین! ئێمەش هەر موسڵمانین، باوەڕمان بەخوا هەیە.

دڵپاك: پەنا بەخوا، چاوەكەم من كەی ناوی ئێوەم بەكافر بردووە؟! ئەوەندە هەیە لە ئیسلام تێنەگەیشتوون سا لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئاواتیشم ئەوەیە كە ئێوەو هەموو خوشكو برایەكی موسڵمان بەوردیی لەئیسلام بگات.

ئەگەر شتێكیشتان لەبارەی ئیسلامەوە بیستبێ یان پێیان گوتبێ نەك هەر پچڕ پچڕ، لەوانەیە بەهەڵە یان بەپێچەوانەوە بووبێتو خۆشتان نەگەڕاون بەدوای شتەكەدا هەتا تاقی بكەنەوەو ئەوسا بیخەنە گەنجینەی بیرتانەوە.

ئەوەش بزانن كە زانیاریی ـ لەبارەی هەرچییەوە بێت ـ گەر بێتو پچڕ پچڕو ناتەواو بێت گەڵێ جار زیانەكەی لەوە زۆرو خراپترە لەوەی كە خاوەنەكەی هەر هیچ نەزانێت، چونكە ئەو كەسەی كە هیچ نازانی لەوانەیە هەوڵبدات بۆ فێربوون، بەڵام

[1] تەماشای دیوانی "سروەی بێداریی" بكە.

ئەو کەسەی کە هەندێ زانیاریی پچڕ پچڕو شپرزەو ناتەواوی لا کۆبۆتەوە، وای لێ ئەکەن کە قایل بێ پێی و خۆی بەلاوە پەسەند بێت، ئیتر ناگەڕێت بەدوای ئەو ڕاستییەدا کە لێی گوم یان بزر بووە. گیرۆدە ئەبێت بەبێئەوەی هەست بە نەزانیی خۆی بکات، کە ئەوەش نەفامیی و نەزانییەکی قووڵە، بەدی خوێندەوارانی ئێمە کتومت لەمەدایە.

بەڵێ.. ئەو بەلا بەدەی کە دەستو پێی ڕۆڵەکانی ئیسلامی بەستووە ئەمڕۆ، بەنێرو مێیانەوە لەم ڕووەوەیە کەپێم گوتن. زانیاریی و زانستێکی وردو قوڵیان لەبارەی ئایینەکەیانەوە . ئیسلام . نییە، ئەو پەڕەکەی ئەوەیە هەندێ قسەو پەرستش و شتی تر لەڕێگەی چاولێکردنەوە "تقلید" لەدایك و باوك و کەسوکاریانەوە . کەزۆربەیان نەخوێندەوارن . فێربوون، یاخود هەندێ زانیاریی پچڕ پچڕو لاوازیان لەم لاو لەولا لا کۆبووەتەوە، ئەویش نەك بەپاك و پوختکراویی، بەڵکو تێکەڵ بەشتی پڕو پووچ و وەهەو چیرۆکی پیرەژنانەی بێجێ، کە هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوە نییە، بەو جۆرە لەمێشکیاندا وێنەو نیگارێکی ناشیرین و شێواو نابەجێ نەخش بووەو پێی ئەڵێن ئیسلام!!

وێنەو نیگارێ جوانترین دیمەنی ئەوە ئەنوێنێ کە ئایین دژی ئافرەتە، هۆی بەدبەختی و کلۆڵییەتی، مافی پێشێل ئەکات، لەوەش خراپ و سامناکتر دژی زانیاریی و زانستە، ئالەم جۆرە قسە پووچەلانە.

سکالا: زۆر ڕاست ئەکەیت، باس و مەبەستەکەت پڕاوپڕ پێکا، بەلام ئەی چار؟

دڵپاك: ئەبێ چاو بکەینەوە . خوشکە بەڕێزەکانم . وریا بینەوەو تێبگەین کە ئیسلام ئەو چیرۆك و شتە بێ ناوەڕۆکانە نییە کە لەدەمی هەندێ پڕو پیرەژن و نەزان، یان دوژمنانی ئیسلام ئەیان بیستین، تەنانەت ئەوەش نییە کە لە هەندێ پەڕاودا . کە ڕەنگێکی ئیسلامیان کراوە بەسەرا . ئەیخوێنینەوە، چونکە چەندەها کتێب پڕ لەشت و باسی ئیسلامت بۆ ئەکات، کەچی وەك هەنگوینێك، کەژاری تێکرابێت وەهایە.

سکالا: دەی باشە، ئەی چار؟ ئەی چۆن ئیسلام بناسین؟

دڵپاك: ئەو ئیسلامەی کە پێویستە بیناسین، کە پاك و بێگەردە، کە ژیانمان ئەگۆڕێت ژیانێکی مرۆڤانەی پاك، ئەو ئیسلامەی کە خوای گەورە کردوویەتی بە بەرنامە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، ئەوەیە کە قورئان نیشانمان ئەدات، کە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەری ئەخات.

بەڵێ.. خوشکە ئازیزەکانم ئیسلام ئەوەیە، سەرچاوەکانی ئەو دووانەن، نەك ڕازو چیرۆك و شتی پڕوپووچی هەڵبەستراو، جا هەرکەسێك ئەیەوێ ئیسلام بەپاکیی و چاکیی بناسێت، شارەزای بەرنامەکەی بێت، کەڵك لەیاساکانی وەربگرێت با لەو دوو سەرچاوە پاکەوە دەست پێبکات، لە قورئانەوە کە یەکەمین قوتابخانەی ئیسلامە، با خۆی بکات بەقوتابی ئەو قوتابخانە بەرزە بێوێنەو شارەزایی وەدەستبێنێ، ئەمجا ڕوو بکاتە سوننەتی بەرزو پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، واتە گەڕانەوەمان بۆ لای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ڕاستترین ڕێگەیە بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام، لەو دوو قوتابخانە بەرزەوە، کە لەبەر دەستماندان ئەتوانین بەقوڵیی و وردیی لە ئیسلام تێ بگەین، ئەمەش بۆ ئێمەی خوێندەوار قورس و گران نییە.

ئاواز: خۆزگە هەموو موسڵمانێك بەمشێوەیەی تۆ ئەدوا دڵپاك.

سکالا: بەخوا ئێمە لەڕووی ئیسلامەوە هەرچی ئەزانین لە خەڵکەوە بیستوومانە، خۆمان هیچ پەڕاوێکی ئیسلامییمان نەخوێندووەتەوە.

# بەشی پێنجەم

## شیاوی ئافرەت و پیاو یەك شیاوییە

سكالاَ: لەباسەكەدا وشەی شیاویم بەر گوێ كەوت، بەلاَم لێی تێنەگەیشتم، حەز ئەكەم تێمگەیەنیو ئەوەم بۆ ڕۆشنبكەیتەوە.

دڵپاك: بۆچی نا؟ بەسەر چاو شیاویی "الأهلية" ئەو بەستەرەیە كە نێرو مێ لەڕووی ئەركو مافەوە لە ئیسلامدا بەیەكەوە، لەڕووی یەكسانییەوە، ئەبەستێت بەیەكەوە.

ئەوەش شتێكی ئاشكراو دیارە لەئیسلامداو هەموومان ئەیبینین، ئەو ئەركانەی كە لەسەر پیاو پێویست كراون، هەروەها ئەو مافانەی كە پیاو هەنی ئافرەتیش هەیەتی وەك یەكو بێجیاوازیی، ئەی یەكسانیی لەوە جوانتر ئەبێ كامەبێ؟

ئایا پێنج فەرزەی نوێژ، ڕۆژووی ڕەمەزان، زەكاتدان، حەج كردن، وەك یەك پیاوو ئافرەت ناگرێتەوە؟ ئەی ئاینداریی، ساماندارییی، فێربوونو فێركردن، لایەنە كۆمەلاَیەتییەكانی ژیان، لایەنی جیهادكردن، میرات بردنو مافی خاوەنداریێتی پیاوو ئافرەت وەك یەك تیایاندا شیاوو خاوەن ماف نین؟

ئاواز: بەلاَم ئەم جۆرە شتانە كە تۆ ناویان ئەبەیت، لەواقیعدا قەت نەماندیوون، بەڵكو هەر باسیشیان نییە!

دڵپاك: بەلاَم ئەگەر بەوردیی تێبگەیت ئەوسا ئەزانی كە ئەم واقیعەی كە تۆ ئەیبینیو شتی لێوەرئەگری شتێكەو ئیسلام شتێكی ترە، بگرە لەیەكەوە نەك هەر دوورن، بەڵكو[1] ڕاستیی وەهایە كە تەماشای خەڵك لەڕوانگەی ئیسلامەوە بكەینو بناسین.

كە تەماشای ئیسلاممان لە قورئانو سوننەتەوە كردو دراسەمان كرد، ئەوسا زۆر بەڕوونی ئەبینین كە ئادەمیزادەكان بەنێرو مێیانەوە، بەهەموو زمانو ڕەگەزو بنەچەو ڕەنگەكانیانەوە وەك یەك شیاون، ئەو تێڕوانینەی كە لە كۆندا هەبووە یان ئێستا هەیە بەرامبەر ئافرەت هەڵەو پڕ لەجەور بووەو ئەبێ، چونكە شیاویی پیاوو ئافرەتیان تێدا بەڕاستییو بەتەواوییو لەسەر بناغەی دادپەروەریی بەدی ناكرێت، كەچی لە ئیسلامدا ئەو شیاوییە بۆ نێرو مێ یەك شیاوییە.

سكالاَ: داوات لێ ئەكەم باسەكە بەدرێژی بخەرە ڕوو.

## شیاوی ئایینداری

دڵپاك: لە ئیسلامدا ئافرەتو پیاو دوو لایەنی وشەی "الناس"ن، بانگەوازی خواو پێغەمبەر ﷺ بۆ "الناس"ە، واتە بۆ ئافرەتو پیاو، هەروەك یەكو بەبێ جیاوازیی، بەشێوەیەكی تر بیڵێین، مرۆڤایەتیی ئافرەت خۆی لەخۆیدا شیاوییەكی گیانییو ژیرێتییە بۆ ئەو ئەركو داوالێكردنە، ئەمەش زۆر بەڕوونی دەرئەكەوێ لە ناو كرۆكی فەرمانەكەی خوادا كە ئادەمو حەوا وەك یەك ئەدوێنێ، ئەها حەوا لەگەڵ ئادەمدا بەشدارە بەبێ جیاوازیی، چ لە فەرمانەكەدا، چ لە نەهیی

[1] بەڵكو زۆر جیاوازن، ئێمە نابێت تەماشای ئیسلام لە واقیعیی ئەم خەڵكەوە بكەین.

لێکردنەکەدا: (وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ) (البقرة: ٣٥).

لەکاتی ڕوودانی سەرپێچییەکەشدا لێپرسینەوەیان وەك یەك بوو: (أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ) (الأعراف: ٢٢).

ئینجا بۆ چەسپاندن بنچ بەستکردنی یەکساینی ئافرەتو پیاو لەو شیاوێتییەدا، ئافرەت سەربەخۆییەکی تەواوی دراوەتێ، بەجۆرێکی وەها هەر یەکەیان بەرپرسیاریی تایبەتیی خۆی هەیە، چ بەرامبەر خۆی، چ بەرامبەر خوا، چونکە هیچ کەسێك تاوانی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێت، تەنانەت ئافرەتان خۆیان پەیماندان "بیعە"ی تایبەتی خۆیانیان هەبووە لە ئیسلامدا، بۆ ئەوەی هەر یەکە لەو ئافرەتانەی کە موسڵمان ئەبوون سەربەخۆیی خۆی لەباوکی یان مێردەکەی تەنانەت لەباوەڕهێناندا جیابێت، کە ئەوەش بەرزترین پلەی سەربەستیی بیرو باوەڕە : (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (الممتحنة: ١٢).

جا نازانم لەوەی کە بیستتان چیتان وەرگرت؟

سکالآ: ئەوەم بەبیردا دێت، کە ئیسلام وای بڕیار داوە، ئافرەتان خۆیان بەرپرسیاری خۆیانن هەر وەك پیاوان، بەرپرسیارییەکی تەواو.

دڵپاك: سوپاس بۆ خوا، بۆچوونەکەت جوانو ڕاستو ژیرانەبوو، ئینجا لەسەر بنەڕەتی ئەو بەرپرسیاریەتە، ئافرەتیش وەك پیاو، لە تەرازووی پاداشو سزا وەگرتنەوەی ڕۆژی دواییدا، هەر یەکەیان بەگوێرەی کردەوەکەی دنیای ئەدرێتەوە بەبێ ئەوەی ئەوە ڕەچاو بکرێت ئەمەیان نێرینەو ئەوەیان مێینەیە، ئەمەتا لە دنیادا هەر دوو لایان ملکەچی ئەم یاسا خواییەن: (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ..) (آل عمران: ١٩٥).

بەوە ئەو گرێ کوێرەیەی کە یاساو کۆمەڵگەو گەلو شارستانیەتەکانی جیهان گیریان خوارد بوو بەدەستییەوە بۆیا ن نەئەکرایەوە، ئیسلام بەیاسا پیرۆزە بێوێنەکانی خۆی کردییەوە، دیارە بەوەش سەری ئافرەت بەرزبۆوە، پلەو نرخی گەیشتە هی پیاو، ئەی ئەوە یەکەم هەنگاو نییە بەرەو یەکسانییو بەختیاریی؟

ئەی ئەوە نەبوو لەهەندێ ئایینو یاساکاندا تەنانەت بەخاوەنی گیانیان دانەئەنا، چ جا لەگیانو خواپەرستیدا یەك موو لەپیاو کەمتر نەبێت؟ گەر ئەوە گەورەترین شۆڕش نەبێت ئەی شۆڕش کامەیە؟

هەروەها لەڕووی پاداشو سزای ڕۆژی دواییەوە ئەمە یاسای بەرزی خواییە: (وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيراً) (النساء: ١٢٤)، هەروەها: (كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ) (المدّثر: ٣٨). (مَنْ عَمِلَ صَالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ) (فصلت: ٤٦).

خۆ ئێوە مامۆستانو خوێندەوارن، ئەشتوانن لەزانایانی زمان بپرسن: ئایا ئەگونجێو ڕاستە کە ئافرەت لەوشەی "کل" یان "من" دەربکرێت بەو ناوەی کە ئافرەت ناگرێتەوەو مەبەست تەنها لەو دوو وشەیە یان یاساکانی تری قورئان پیاوەو بەس؟!

ئاواز: پێویست بە پرسیارکردن ناکات، چونکە هەردووکیان بۆ هەردووکیانن.

سکالآ: وازم لێبێنن با هەناسەیەکی دڵ حەسانەوە بە ئۆخەییەوە بدەم.

دڵپاك: ئێستا هەر ئەوەندەم لەدەست دێت کە بەسۆزەوە پێتان بڵێم:

ئەو شۆڕشەی پلەو پایەی تۆی هێنایە ڕیزی پیاو
بێ وێنە بوو، خودایی بوو، لەگەڵ فیترەتدا ڕێك، گونجاو
دە مەردانە لەسایەیدا هەنگاو بنێو گومڕا نەبیت
بەهاژو هوژ تەفرەت نەدەن، خۆت نەخەیتە گێژی گێژاو

## شیاوی ئابووری

ئاواز: لەو لایەنەوە ئیسلام هیچ گلەیی لەسەر نییە، بەڵام لەڕووی سامان، ڕوونتر بیڵێن لەڕووی ئابوورییەوە لای نەکردووە بەلای ئافرەتەوە.

دڵپاك: خوشکە ئاواز، ئەزانم کە مێشکت کۆمەڵێك لەزاراوەی ئابووریی تێخزێنراوە، بەڵێ ئابووریی دەورێکی گرنگ و کاریگەری لەهەموو ڕووەکانی ژیانی ئادەمیزاددا هەبووەو هەیە، سەربەخۆیی و شارستانییەت بێباشبوونی ژیانی ئابووریی زۆر بەزەحمەت بەدی دێن و سەرئەگرن.

بەڵام ئەگەر بێتو لەدەروازەی کەرامەتی مرۆڤایەتییەوە تەماشای مەسەلەکە بکەین، بۆمان دەرئەکەوێت کە ئیسلام، بەتەنها ئیسلام، ئافرەتی ڕزگارکرد لەدەست کورتیی و ڕووتاوەیی و لەڕووی ئابوورییەوە، کە هەزارەها، بگرە ملیۆنەها ساڵ بوو ئابووریی یەکێك بوو لەو هۆیە گرنگانەی کە سەری بەندایەتیی بە ئافرەتی بەسەرزمان دانەواندبوو.

لەم دواییەدا یاسا زەمینییەکان دەستیان کرد بە گۆڕینی ئەو حاڵ و وەزعەی بەڵام بەکردنی ئافرەت بە ئەندامێکی ئیشکەرو پەیداکەر، کە ئەوەش دەیان دەردو بەڵای کلۆڵی و بەدبەختیی هێنا بەسەر ئافرەتی هەژاردا، دیارە هیچ ئەقڵێکی ساغ ئەوە پەسەند ناکات کە دەردێك بە سازدانی چەند دەردێك چارەسەر بکرێت.

ئاواز: بەڵام پێم ناڵێیت ئیسلام لەڕووی ئابوورییەوە چی بۆ ئافرەت کرد؟

دڵپاك: ئافرەت هەر بەو پێیەی کە وەك پیاو شیاوی ئایندارییی پێبەخشرا لەلایەن خواوە، شیاویی ئابووریشی پێبەخشرا، ئەمەش وەك باسمان کرد، بەپێچەوانەی یاساکانی ڕۆمانەوە بوو کە مێیەتی "الأنوثة"ی ئافرەتی بەناشیاویی ئەدایە قەڵەم، لەناو عەرەبیشدا هەر بەو جۆرە بوو، بەتایبەتی لەڕووی ئابوورییەوە.

خۆری ئیسلام هەڵهات، مۆڵەت و مافی بەئافرەت، وەك پیاو، بەخشی، تا ئافرەت بتوانێ دەستبکات بە بەجێهێنانی مافی خۆی لەهەموو سەرێکەوە لەوانەش مافی ساماندارییی و ئابووریی، ئەمەش گەیشتە ڕادەیەك کە ئافرەت بتوانێت ببێتە خاوەنی موڵك و سامانێکی زۆر بەپێی توانای خۆی، فەرموون گوێ بگرن لە یاسای ژمارە حەوتی سوورەتی "النساء" کە ئەفەرموێ: (لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيباً مَّفْرُوضاً) (النساء: ٧).

ئەمە لەڕووی میراتەوە، لەکاتێکدا پێش ئەم یاسا قورئانییە ئافرەت خۆی بەشێك بوو لەمیرات و بۆ پیاوان ئەهاتەوە! هەڵگرتنی ئەو هەنگاوە شتێکی کەم نەبووەو نییە خوشکان، گەورەو بەرزو پیرۆزە.

لەڕووی پەیداکردنەوە "الكسب" لەیاسای ژماری(٣٢)ی سوورەتی (النساء)دا بەم جۆرە ئەفەرموێ: (..لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ..) چ جیاوازییەك لەنێوان ئافرەت و پیاودا بەدی ئەکرێت؟ بۆ چی بکرۆزێتەوە بۆ ئابووریی و تاك و کەی؟ ڕەنگە نەزانن کە میراتی لەباوك، مێرد، برا، کوڕ، خزمانی ترەوە بۆ دێتەوە؟!

ئەوە لەلایەکەوە میراتی بۆ دێتەوە، لەلایەکی ترەوە بۆی هەیە کاسبی بکات. کاسبی ڕەوا. جگە لەوەش کاتێ شوو ئەکات ئەبێتە خاوەنی مارەیی، ئەو مارەییە هی ئافرەتەکەیە بەتەنها، مافی هیچ کەسێکی پێوە نییە، هەرکەس یەك غەرامی لێ دابڕ بکات بەدەستدرێژیی دائەنرێت و حوکمی ئیسلامیی ئەدات بەناو دەمیا، کەچی لەڕۆماندا تەنانەت ئەو مارەییە باوك یان برا، یان بەخێوکەری ئافرەتەکە ئەیبردو ئەبووە هی خۆی، بەچوون و گواستنەوەی بۆ ماڵی مێردەکەی هەر کەلوپەل و جیازییەکی ببوایە واتە "دوطه"کەی ئەبووە هی مێردەکەی، لەشوێنەکانی تریشدا کار لەهی ڕۆمانییەکان چاکتر نەبووە بەرامبەر ئافرەت.

ئەی بۆچی مەمنوونی ئیسلام نەبین کە ئەفەرموێ: ((وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً..) (النساء: ٤). بەتەوایی و بێکەمو کورتیی بیاندەنێ! ئەگەر یاسایەکی داتاشراو ئەوەی بۆ ئافرەتان بکردایە خۆ ئەمانکرد بە گاڵەو هەموو دنیامان پڕ ئەکرد لە پڕوپاگەندە بۆی! ئەوە بۆچی؟

دەی با گوێ لە ئیبن حەزم بگرین، کە لەم ڕووەوە ئەنووسێت: "نابێ ئافرەت ناچار بکرێت کە جیازیی ڕێکبخات بۆ مێردەکەی، ئەو کارە لە بنەڕەتا نەگونجاوە، چ لەماڵی خۆی چ لەمارەییەکەی، ئەتوانێ چی لە مارەییەکەی بکات بیکات، بێئەوەی مێردەکەی بۆی هەبێت ڕێگە بگرێت و قەدەغەی بکات.." دیسان ئەڵێت: "باوکی کچ، چ گەورە بێ یان بچووك، یان بێوەژن بێت ڕەوانییە بۆی یاخود بۆ یەکێکی تر چ خزمی و چ بێگانە، لەمارەیی کچەکەیدا یان خزمەکەیدا دەستی تێبخات یان شتێکی لێببەخشێت بەو کەسەی کە بیەوێ. واتە باوکەکە یان خزمەکەی بیەوێ. کەچی ئافرەتەکە بۆی هەیە بەشێکی یان هەمووی بەو کەسەی کە خۆی حەز ئەکات ببەخشێ بێئەوەی باوك یان مێرد یاخود کەسێکی تر ڕێی لێبگرێت و لەوەدا قەدەغەی بکات"[1].

هەروەها مافی هەیە زەویی و زار، مەڕو ماڵات، ئاژەڵ، خانووبەرە، هەموو چەشنە ماڵێك بەهەموو جۆرەکانی خاوەندارێتی هەبێت، ئەتوانێت بازرگانیی، کاسبی بکات بەو مەرجەی حەڵاڵ بێت و لەڕێگەی ڕەواوە بیکات.

مافی ئەوەی هەیە پەنای خەڵك بدات و خەڵکیش پەنای ئەو بدات، ئەتوانێ لەوەی کە هەیەتی ببەخشێ، سەوقاتی بنێرێ بۆ کەسانی تر، بۆی هەیە لەدادگا ڕوو بەڕووی دوژمن بوەستێ یاخود وەکیل بۆ ئەوە بگرێت.

مامۆستا "محمد عبده" خوا پاداشتی بداتەوە لەم بارەیەوە ئەڵێت: "لەئیسلامدا، ئەو پلەیەی کە خوا ئافرەتی بەرزکردەوە بۆی، لەهیچ ئایینێکی تردا نەبووە، لە هیچ شەریعەتێکی تردا پێی نەگەیشتووە، نە لە پێش ئیسلامدا نە لەدوای ئیسلامیش هیچ نەتەوەیەك نەیتوانی ئەم هەنگاوە بەرزە بنێت. ئەو نەتەوە خۆرئاواییانەی کە خاوەنی شارستانیەتن و زۆر زیادەڕۆیی لەڕێزگرتنی ئافرەتدا ئەکەن، کە بایەخ بەفێرکردن و پەروەردەکردنیان لەڕووی هونەرو زانیارییەوە ئەدەن، هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەم پلە بەرزە کە ئیسلام ئافرەتی گەیاندە ئەوێ، تا ئێستاش هەندێ یاسا قەدەغەی ئافرەت لەبەکارهێنانی ماڵی خۆیدا ئەکات، بێپرس و مۆڵەتی مێردەکەی ڕێگەی پێنادرێت"[2].

ئائەمە بەشێکە لەو کۆت و زنجیرەی. گەر ئیسلام کۆت و زنجیری هەبێ. کە لە سایەی ئیسلامدا ئافرەتی پێ شەتەك دراوە!! ئێستە چۆنە!

سکاڵا: ئەی سەد خۆزگە ئیسلام لە هەموو سەرێکەوە ئاوا بەجوانیی و چاکیی چارەسەری کێشەی ئافرەتی بکردایە، ئای کە بەرنامەیەکی بێوێنە ئەبوو!

ئاواز: ئەمەیان جوان و ڕێکوپێك بوو کە باست کرد گلەییم لێی نییە.

دڵپاك: خوا یاربێت بۆتان دەرئەکەوێت کە نەك هەر ئەوەی کە باسمانکرد بەڵکو لەهەموو سەرو ڕوویەکەوە بەمجۆرە ڕێکو پێك و گونجاوی فیترەی ئادەمیزادە، بەڵام ئێوە نەتان بیستووەو نازانن، چونکە نەتان ویستووە فێری بن و بیزانن، بەوپەڕی داخیشەوە ئەمەتان پێ ئەڵێم.

## شیاوی کۆمەڵایەتیی

دڵپاك: لەبیرتان چۆوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "النساء شقائق الرجال"؟ خۆ پێش ئەوەش گوێتان لە یاسای ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبة)ەوە بوو: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ..) (التوبة: ٧١). ئایا ئافرەت و پیاو هیچ جیاوازییەکان لە نێواندا بۆ دیاری کراوە تا پەیڕەویی بکرێت و بۆنی کۆت و زنجیرەی لێوە بێت؟ کاری هەردوولا هەر فەرمانکردن بە چاکەو نەهیکردن لە خراپە نییە لەناو کۆمەڵگەدا؟

سکاڵا: بەڵێ وەهایە. کاری هەردوو لایان یەك کارە بێجیاوازیی.

دڵپاك: ئیسلام ئەیەوێ کۆمەڵگەیەکی پاك و چاك پێکەوە بنێ، لەوەشدا بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگەیە بێتە دی ئەیەوێ ئافرەت و پیاو بکات بەیەك ڕەگەز "عنصر"ی کاریگەر، بەو پێیەش ئەرکی هەردوولا وەکو یەکە بەڵکو یەکێکە، جگە لە

---

[1] المحلى جـ ٩، ص ٥٠٧ ـ ٥١١.

[2] تفسير المنار، ص ٣٧٥ ـ ٣٧٦.

هەندێ لایەن کە سروشتیان پەسەندی ناکات یاخود لەگەڵ فیترەتیاندا ناگونجێت، بەڵام لەلایەنەکانی تردا ئەرکیان یەك ئەرکە، ئافرەتی موسڵمان هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە ئەو ئەرکەی پێسپێردراوەو بەهۆی ئەوەشەوە لە ئاسمانی ژیاندا درەوشاوەتەوەو بۆتە خاوەنی کەسایەتییەکی ئەوتۆ لەناو کۆمەڵگەدا بە شێوەیەکی وەها لەهەموو ئیش و کارێکدا جێگەی پەنجەی نەخشی دیار بووە.

بەشداریی پیاوی لەچالاکیی گیانیی، کۆمەڵایەتیی، زانیاریی، تەنانەت ڕامیاریی و جەنگیشدا مەردانە کردووە، ئەی وەك پیاو ئەویش زەکات نادات، خێر ناکات، سەر لەنەخۆش نادات؟ پەیڕەویی مافی دراوسێ، فێربوون و فێرکردن، ڕەخنەگرتن لە حوکمڕانان، ئەمانەش بۆ پیاوو ئافرەت هەر وەك یەك شیاوو ڕەوا نین؟

هەروەها کاتێ کە پێگەیشت و بەڵگەی پێگەیشتن و کارچاکیی و ژیریی لێ دەرکەوت بۆی هەیە چاودێری و سەرپەرشتیکردنی باوکی یان ئەو کەسەی کە ئەمی پێسپێردراوە ڕەتبکاتەوە، چونکە خۆی مافی تەواوی دەستکاریی کردنی لە کاروباری دارایی و کەسایەتی خۆیدا هەیەو بۆی هەیە ئەو شوێنەی کە ئەیەوێ تیایا بژی هەڵی بژێرێت و کەس ناتوانێ ناچاری بکات کە لای بمێنێتەوە، بەو مەرجەی خاوەن ژیریی و داوێن پاك و بێگەرد بێ و بتوانێ خۆی بپارێزێ.

بەڵام بەشووکردنی ئەگەر مەرجی لەگەڵدا نەبێت مافی هەڵبژاردنی ئەو شوێنە لەدەست دەرئەکا. ئەزانن بۆچی؟

سکاڵا: شتەکە لەخۆیا ئاشکرایە، چونکە وەها ئەبێ کە ژنەکە لە شاری "أ" دایەو پیاوەکەشی لە شاری "ب" و سەرچاوەی گوزەرانی کە هی هەردووکیانە لە "ب"دایە، ئەگەر ژن مافی هەڵبژاردنی شوێنەکەی لەدەست دەرنەچێت ئەبێ پیاوەکە واز لە سەرچاوەی گوزەرانەکەی بێنێت.

دڵپاك: ئەی ئافرەین، دەست خۆش، زۆر جوانت زانی!

مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم، نووسیویەتی و ئەڵێت: "مێینە کاتێ گەیشتە تەمەنی ژنیەتیی، ئەگەر کچێکی گەنج یان بێوەژن بوو، باوکی یان ئەو مەحرەمەی کە ئەوی لایە، لێی دڵنیا نەبوو، بۆی هەیە ناچاری بکات کە لای بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر کچێکی بەتەمەن یاخود بێوەژن بوو، ڕاو بیرو پاکیی خۆی پاراست و دڵنیای پارێزراویی خۆی بوو، کەسێ لە کەسەکانی بۆی نییە بەزۆر لای خۆی نیشتەجێ بکات، بەڵام کەشووی کرد ئەو مافەی نامێنێ و ئەردێت بەمێردەکەی"[1].

لەوەش زیاتر، ئیسلام مافی ئەوەی داوەتێ کە بتوانێ بەسەربەستیی ڕای خۆی لەکاتی بەشوودانیدا یان شووکردنیدا دەربڕێت قسەی بخوات، ئەتوانێ پەسەندی بکات یاخود بیداتە دواوە "البنت أحق بنفسها من وليها"[2]. ئایا تا ئێستاش لەسایەی هیچ شارستانیەتێکدا ئافرەت گەیشتووەتە ئەو پلە بەرزە کە بتوانێ لەکاتی جەنگ و ئاشتییدا پەنای ئافرەت یان پیاو بدات؟ کەسیش مافی زەوتکردنی ئەو مافەی نەبێت! "ئوم هانیئ کچی ئەبو تالیب" پەنای کابرایەکی موشرکی دا، عەلی کوڕی ئەبوتالیب ئەیویست بیکوژێ،، ئوم هانیئ چووە لای پێغەمبەرﷺ و ئاگاداری کرد، ئەویش فەرمووی: "يد المسلمين على من سواهم تتكافأ دماؤهم ويجير عليهم أناهم". "قد أجرنا من أجرت يا أم هانئ". (اسلامنا السيد سابق).

خاتو عائیشە ئەگێڕێتەوە: "ان كانت المرأة لتجير على المؤمنين فيجوز". پاراستنی گیان و سامان و ئابڕوو بۆ پیاوو ئافرەت یەك جۆرە یاسای هەیە، فەرمانەکانی ئیسلامیش بۆ ئامۆژگارییکردن نییە، بەڵکو بۆ پەیڕەوکردن و جێبەجێکردنە.

سکاڵا: خەریکە بەرەو دڵخۆشیی نزیك ئەبمەوە، خەریکە ئۆخەی ئەکەم.

## شیاوی زانیاریی

ئاواز: خوشکە دڵپاك، ئەگەر پیاوو ئافرەت بەیەك چاو تەماشا ئەکرێت لە ئیسلامدا، ئەی بۆچی ڕێگەی خوێندنی لێئەگیرێت؟

دڵپاك: من ناڵێم ڕێگەی لێنەگیراوە، بەڵام ڕێگا لێگرتنی شتێکە یان کارێکە کە لە ئیسلامەوە وەرنەگیراوە، لەبەر ئەوەشە ئیسلام لەوەدا بەرپرسیار نییە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە هەموو شتێك بەزانیاریی ناژمێرێت، بۆ نموونە کەسێکی

---

[1] تەماشای (الاسلام وقضايا المرأة المعاصر)ی بهی الخولی بکە.

[2] زادالمعاد ـ ابن قيم الجوزية.

لێزان ئەگەر کۆمەڵێك فێری هونەری دزیی بکات، ئایا ڕەوایە بەو کارە بگوترێت زانیاریی؟ ئەگەر پێیشی بگوترێت زانیاریی‌و هەندێ کە ڕۆڵەکانی خۆی نەنێرێتە لای ئەو کابرایەو نەیەوێت فێری دزیی ببن، ئایا بە تاوانبارو دژی زانیاریی دەژمێردرێت؟

ئاواز: وەلامی هەردوو لقی پرسیارەکە بێگومان "نا" یە.

سکالاً: کەواتە ئیسلام ڕێگە لەفێربوون‌و فێرکردنی ئافرەت ناگرێت.

دڵپاك: من سەرم لە هەندێ قسەو پرسیارتان جاروبار سوڕئەمێنێ، نازانم چۆن ئەوەندەش بەسادەیی ئەو جۆرە شتانەتان وەرگرتووە.

ئیسلام نەك هەر داوای زانیاریی ئەکات‌و بەس، بەڵکو داواکردن‌و هەوڵدان بۆی بە خواپەرستیی دائەنێ، بەقووڵیی داچوون تیایا بە تەسبیحات‌و گەڕان بەدوایا بەجیهادو فێرکردنی نەزان بەخێرو بەخشیینی بە خەڵك، واتە بڵاوکردنەوەی، بەنزیکبوونەوە لەخوا دائەنرێت.

**پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت:** "من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل له طريقا الى الجنة". لەوەش گرنگتر خوای گەورە بە وێنەی پرسیار ئەفەرموێت: (..هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُون..) (الزمر: ٩). باسیی گرنگیی و فەزڵی زانیاریی لەئیسلامدا ئەوەندە فراوانە ئێستا وا بەسەرپێیی بە من ناکرێت، تەنها باسی ئەوەتان بۆ ئەکەم کە ئافرەتیش تێیدا وەك پیاو خاوەنی مافەو هیچ جیاوازییەك لەنێوان نێرو مێدا لەو ڕووەوە نییە.

ئەمەش بەنیسبەت گیانی ئیسلامەوە شتێکی سەیر نییەو زانیاریی گرنگ‌و بەکەڵکەو یەکێکە لەو ڕەگەزانەی کە کەسایەتیی بەهێزو ڕێگا بەرەو پێشکەوتن‌و ئادەمیزاد بەرەو شارستانیەت ئەبات‌و نزیك ئەکاتەوە، ڕێگا کورت‌و هەوڵدان ئاسان ئەکات، جا زانیاریی ئا بەو جۆرە بە کەڵك بێت، ئیسلام چۆن ڕێگا لە ئافرەت ئەگرێت یان جیاوازیی ئەکات لەنێوان نێرو مێدا؟ نەخێر. بەڵکو ئافرەت وەك پیاو بەشیاو ئەزانێت لە زانیارییشدا، بەڵکو هەر وەك پیاو بەرپرسیارەو پێویستە کەسایەتیی وەك هی پیاو تەواو بەهێز بێت. هەروەها زانراوەو ئاشکرایە کە هەرچی لە ئیسلامدا خوا لەسەر پیاو فەرزی کردووە، لەسەر ئافرەتیش فەرزی کردووە، واتە هەر وەك لەسەر پیاو زانیاریی فەرزە، هەر بەو جۆرەش لەسەر ئافرەت فەرزە. "طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة". رواه بخاري.

ئایا چیتر گومان لە دڵدا جێی ئەبێتەوە؟ نەك هەر حەز بەفێربوون‌و فێرکردن بەڵکو بە فەرز لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ باسکراوە لەسەر نێرو مێ فەرز کراوە، جا هەرکامیان کەمتەرخەمیی تێدابکات بەگوناهباریش دادەنرێ، لەوەش گرنگتر، ئیسلام داوامان لێئەکات کە خزمەتکارەکانیشمان . لەئافرەت . فێری زانیاری بکەین تەنانەت ئەوانەشیان کە کەنیزەکن، بەڵکو لەپاڵ ئەوەشدا خوا پاداشمان ئەداتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "ايما رجل كانت عنده وليدة فعلمها فأحسن تعليمها وأدبها فأحسن تأديبها، ثم أعتقها وتزوجها فله أجران". (بخاري ومسلم).

مەسەلەکە لەئیسلامدا ئەوەندە گرنگیی پێدراوە تەنانەت یەکێك لە مافەکانی ژن بەسەر مێردەکەیەوە ئەوەیە کە فێری زانیاریی بکات ئەگەر نەزان بێ، خۆ ئەگەر ژنەکە بیەوێت فێر بێت، بەلام مێردەکەی فێری ناکات، پێویستە لەسەری لە ماڵەکە بچێتە دەرەوە بەبێ ئەوەی داوای مۆڵەتی لێبکات‌و ڕێگەی فێربوون بگرێتەبەر.

سکالاً: الله .. الله!! ئەم ئیسلامە شیرینە چۆن شاراوەتەوە لێمان! چۆن لەگەڵ ئافرەتا کردوویانن بەدوو دژا!! ئای چ ستەمێکە!

دڵپاك: مێژووی ئیسلام گەواهیی لەسەر ئەم ڕاستییە ئەدات‌و باسی ڕادەی بڵاوبوونەوەی زانیاریی لەنێوان ئافرەتە موسڵمانەکاندا بەدرێژی ئەکات بۆمان، باسەکە دوورو درێژە، بەلام چەند نموونەیەکتان ئەخەمە پێش چاو: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتان وەك پیاوان ئایین‌و ڕەوشت لەپێغەمبەرەوە ﷺ فێر ئەبوون، پێغەمبەر ﷺ کاتی بۆ ئافرەتان دیاری کردبوون، لە خزمەتیا دائەنیشتن بۆ فێربوون، هەروەها ژنە بێگەردەکانی بەتایبەتیی خاتو عائیشە هەر یەکەیان مامۆستایەك بوو ئافرەتان‌و پیاوان وانەیان لا ئەخوێندن، تەنانەت گەورە یارانی پێغەمبەرو چینی دوای ئەوانیش لەو ژنانەی پێغەمبەرەوە فەرموودەو تەفسیرو فیقهیان وەرئەگرت‌و فێری ئەبوون. ئایا هیچ نیشانەیەکی نەشیاویی ئافرەت

لە ئیسلامدا لەبارەی زانیارییەوە بەدی ئەکرێت؟ یەکێك لەزانایانی ئیسلام (ئیبن عەساکر) باس ئەکات کە لای سەدو هەشتا ئافرەت دەرسی خوێندووە. واتە. مامۆستایی ئەویان کردووە، نازانم بە چ ڕوویەکەوە ئیسلام تاوانبار کەین کە گوایا ڕێگە نادات بەئافرەت بۆ فێربوون؟

سکالاَّ: مەگەر تەنها بەو ڕوەوە کە مانای شەرمو تەریق بوونەوە نازانێت.

ئاواز: بەلاَم تەنها بۆ زانیارییە ئاییینییەکان ڕێگەی پێدراوە.

دڵپاك: سبحان الله! ئەی من بۆ چی ئەوەم لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەبینیوە؟ ئای کە ڕێگەی ڕێ پێگومکردنو سەر لێشێواندن زۆرو جۆر بەجۆرە! مامۆستا ئاواز، ئەو زانیارییەی کەئیسلام لەسەر ژنو پیاو فەرزی کردووە ئەو زانیارییەیە کە کەڵکی بۆ زاناکەو خەڵکی تر هەبێت، ئەوەش هەموو زانیارییەکی بەسوود بەهەموو جۆرەکانییەوە ئەگرێتەوە، ئەوەندە هەیە ئیسلام وا بەچاك ئەزانێ ئافرەت لەپێشەوە فێری زانیاریی ئایین بکرێت، ئینجا ئەو زانیاریانەی کە لەگەڵ سروشتو گرنگی ژیانی ئافرتدا ئەگونجێتو پێویستیی پێیان هەیە، بۆ ئەوەی ڕەوشت بەرز، ڕازاوە بێت خووی جوان، پسپۆڕ لەکاری خۆیدا بێتە مەیدانی ژیانەوە.

ئیسلام ئەیەوێ ئافرەت زانا بەئاییینەکەی، هاوسەرێکی تێگەیشتووی مێردەکەی، دایکێکی پەروەردیاری بەسۆزی جگەرگۆشەکانی، بەڕێوەبەرێکی لێزانی ئیشوکاری ماڵو خێزان، ئابووریزانێکی وردبێت، ئایا ئەمە لەنرخی ئافرەت کەم ئەکاتەوە؟ ئایا ئەو سیفەتانە کەمن ئەگەر لەئافرەتدا هەبن؟

خۆ ئەگەر ئافرەتێك یان ئافرەتان خاوەنی ژیرییەکی بەرزو بیرێکی بەپیت بوونو تواناو لێهاتنیان تێدا بەدی کرا، دەرگای چوونە پێشەوە لەلایەن ئیسلامەوە وازەو ئافەرینیش ئەکرێن، گرنگ بەلای ئیسلامەوە هەر تەنها ئەوەیە کە زانیارییەکە بەکەڵك بێتو ڕێگەی فێربوونو فێرکردن پاكو ڕەوا بێتو ئادەمیزاد بەرەو ئادەمیزادیی بەرێت، ئایا ئەوە بە خاڵی ساردو سڕیی دادەنرێت؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کەبیرێ بکەینەوە؟

خوشکێ، ئەگەر تۆ وریاو وشیار بی
بەدڵسۆزانە پەروەدە یار بی
کۆمەڵگە باشو هەق جێگیر ئەبێ
ئەگەر تۆ گومڕا دنیاش تار ئەبێ

## شیاوی ڕامیاریو سەربازیی

دڵپاك: تەنانەت ئیسلام لەڕووی ڕامیارییو سەربازیشەوە ئافرەت بە شیاو ئەزانیت، ئەمەش سەیر نییە، چونکە بەشێك بووە لە ژیانی ئافرەت هەر لە سەرەتای هەڵهاتنی خۆری ئیسلامەوە ئافرەت دەستڕەنگینیی خۆی تێدا نواندووە، ئەی یەکەمین کەسێك کە باوەڕی بەئیسلام هێناو بانگەوازەکەی پێغەمبەری ﷺ پەسەند کرد خەدیجەی ئافرەت نەبوو؟ ئەی یەکەمین شەهیدێك کە خوێنیی پاکیی لەپێناوی ئیسلامدا ڕژا "سومەییە"ی ئافرەت نەبوو؟ یەکەمین کۆمەڵێ کە بەرەو حەبەشە چوونو داوای پەنادانی ڕامیارییان لە ئیمپراتۆری حەبەشە کرد حەڤدە کەسیان ئافرەت نەبوون؟ ئایا دەوری ڕامیاریی لەوە بەرزترو پیرۆزتر ئەبێت؟

خوشکێ، یەکەم کەس بێ باكو پەروا
کەخوێنی ڕژا، باوەڕی هێنا
"سومەییە"ی یاسر "خەدیجە"ی زانا
هەر لەئێوە بوون بەلاَم ژیر، دانا
خوشکم، یەکەم پۆل ئاوارەی ڕێی دین
بەرەو "حەبەشە" کەوتە ڕێ بڕیین

